

## نوێژ کردن


• نووسەر: ناصح فتاح •

• بڵا و کاڕ: نەشری ئی‌حسان •

• تیراژ: ۳۰۰۰ دانه •

• ژمارەی چاپ: دووەم-۲۰۰٦ •

• چاپخانه: هورنگ •

• ژمارەی نیونەتە وایەتی: ۹٦٤-۳٥٦-٥۲۲-X •

• ژمارەی سپاردنی: (   ) ساڵی (   ) پێدراوه •

الحمد الله الصلاه والسلام على رسول الله
وعلى اله وصحبه ومن ولاه

نوێژ کۆڵەکەی ئیسلامە، دوای وتنی شایەتومان، یەکەم خشتی سەر بناغەی ئیمانە، لەبەر گەورەیی و مەزنی نوێژ بوو، کەلەئاسمان و لەکاتی میعراجدا فەرزکرا، کۆمەڵگەی موسڵمان بە نوێژ خوێنەکانیدا دەناسرێتەوە، کۆمەڵگەش کاتێك بەختەوەرە تا مزگەوتەکان ئاوەدان بێت، تا نوێژ خوێنی زۆری تیابێت، نوێژخوێنێك کە ئەخلاق و ڕەوشتی ئیسلامی لەخۆ گرتبێت و بەشێك بێت لە چاوپۆشی و سنگ فراوانی.

ئەم نامیلکەیەش، هەوڵێکە بۆ ئاسان کردنی ئەم پرۆسە گەورەیەی ژیان کە نوێژ کردنە تا هەموو چین و توێژێك لێی سوودمەند بێت بە تایبەتیش ڕۆڵە چاوگەشەکانی نەتەوەی کوردزبان تا لە سەر ڕێڕەوی پێشینانیان بڕۆن.

والسلام عليكم و رحمه الله ..
٢٠٠٥/١/٣

# دەست نوێژ

دەست نوێژ گرتن شەش شتە
بیزانە رێی بەهەشتە
نیەت هێنانە بە دڵ
دەم و چاو بشۆ وەك گوڵ
دەست شۆرینە تا ئەنیشك
مەسحی سەرە وەك پێویست
ئەنجا هەردوو قاچ ئەشۆم
بە تەرتیب و بۆی ئەرۆم
ئەمە بۆ دەست نوێژ فەرزە
پیشەی کەسی نەبەردە
ئاینەکەم زۆر جوانە
رێگای پیغەمبەرانە
ئیسلام ئاینی منە
بەرنامە گشت جیهانە
بیگرە گوڵەکەی ئیسلام
تەنها پێنج خاڵی جوانە
شایەتومان ، نوێژکردن
هەم رۆژوی رەمەزانە
حەجی ماڵی خوا کردن
پێنجەمیش زەکات دانە

# خۆپاک کردنه وه

## غوسڵ کردن

بەهۆی لەش گرانی یاخود حەیزو منداڵ بونەوە خۆشتن بە پێویست دەگەڕێ و واجب دەبێت. خۆ شتنیش یا (غوسڵکردن) واتە شۆرینی هەموو لاشە بەئاوێکی پاك بەنیەتی غوسڵ کردن، خۆ ئەگەر لاشە پیس و پۆخڵ بێت ئەوا دەبێت ئەو پیسیە لابرێت و ئەوجا بەنیەتی لابردنی لەشگرانیەوە ئاو بە هەموو لاشەدا بکرێت، بەمەش لەشی پاك دەبێتەوە. دیارە نیەت هێنانیش زۆر ئاسانە، وەك ئەوەی بڵێت لە دڵیدا: (نیەتمە لەش گرانی لەسەر خۆم لائەبەم ) ئەمجا ئاو بکات بە خۆیدا.

## سەرئاو

سوننەتە بە قاچی چەپ بچینە سەر پێشاو، بە دەستی چەپ خۆمان پاکژ بکەینەوە، ئەوجا خۆمان دابپۆشین و بەقاچی ڕاست بێینە دەرەوە، گەر لە دەشتا بوین، دەبێت دوور بین لەسەر ئاو کردن لەسەر ڕێگای خەڵکی و کون و قلیشی زەوی و ژێر دار و درەختی بەر دار و ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە، چونکە دەبێتە هۆی پیس بونی ژینگە ..

وورپابە لە کاتی چوونە سەر پێشئاودا قورئانی پیرۆز یاخود کتێبی فەرمودە و هەر پەرتوکێك کە ئایەت و فەرمودەی تێدا بێت دایبنێ و لەگەڵ خۆتا هەڵیان مەگرە .

## دەست نوێژ گرتن

هەر کەسێك بیەوێت نوێژ ئەنجام بدات ئەوا پێویستە لەسەری دەست نوێژی هەبێت، چونکە هەرگیز نوێژ بەبێ دەست نوێژ ئەنجام نادرێت.

دەست نوێژ گرتنیش دەبێت ئەم شەش فەرزەی تیابێتەجێ کە باسی لێوە دەکەین، ئەوجا پێی دەوترێت: (دەست نوێژ) و دەتوانرێت نوێژی پێوە ئەنجام بدرێت.

پاش ئەوەی دەست نوێژەکەت بەجوانی گرت، ئەوجا بچۆرە ناو نوێژەوەو نوێژەکەت ئەنجام بدە.

## فەرزەکانی دەست نوێژ

١) نیت هێنان
٢) شۆردنی دەموچاو
٣) شۆردنی هەر دوو دەست تائانیشك
٤) مە سح کردنی سەر
٥) شۆردنی هەر دوو قاچ تاقولە پێ
٦) ترتیب و پاش و پێش نە کردنی ئە وانەی باسمان کرد

## سونه تەكانی دەست نوێژ

١) ناوی خوا هێنان ( بسم الله ) كردنه.
٢) شۆردنی هەردوو دەست بەر لە هەموو شتێ.
٣) سیواك كردن.
٤) ئاو وەردان لە دەم و لووت.
٥) دەست خستن لە ڕیشی پڕ.
٦) دەست خستن لەنێوان پەنجەكانی دەست وقاچ.
٧) دەستی تەڕهێنان بەسەر دەرەوەو ناوەوەی گوێدا.
٨) پێشخستنی لای ڕاست بەسەر لای چەپدا.
٩) دووربوون لە زیادەڕەوی لەبەكارهێنانی ئاودا.
١٠) خوێندنی دوعای دوای دوست نوێژ.

# شێوازی دەستنوێژ گرتن



١) سەرەتا بڵێ: (بسم الله)
٢) هەردوو دەستەکانت بە جوانی بشۆ.

٣) سیواك بکەو ناو دەمت پاکژ بگەرەوە.



٤) لووت پاکژ بکەوەوە ئاوی تێ وەردە.



٥) نیەتی دەستنوێژ گرتن بێنەو ئەوجا دەموچاو بشۆ بڵێ:
(نیەتمە فەرزی دەست نوێژ بە جێ دێنم).



٦) جوان دەموچاوم دەشۆم لە (ڕووانی موی سەرەوە تا ژێر چەناگە) و (لە نەرمەی گوێوە بۆ نەرمەی گوێ).



٧) هەردوو دەستەکانم تا ئانیشك دەشۆم و دەستی بەسەردا دێنم.



٨) دەستی ڕاستم یەکەم جار دەشۆم، ئەوجا دەستی چەپم.



٩) مەسحی سەر دەکەم، سوننەت وایە دەستی تەڕ بێنم بەسەر هەموو سەرمدا.





١٠) بەدەستی تەڕ هەردووگوێکانم پاکژ دەکەمەوە.

١١) هەردووقاچم تا قوله پێ دەشۆم، قاچی ڕاستم لەپێشدا دەشۆم ئەوجا قاچی چەپم.

١٢) نێویەنجەکانی قاچم پاکژ دەکەمەوەو ، دەست لە نێو پەنجەکانم ئەخەم.



١٣) ڕوو له قیبله دهکهم و دوعای دوای دهست نوێژ ئهخوێنم، کهبهم شێوهیهیه:

اشهد ان لا اله الا الله وحده لاشریک له واشهد ان محمدا عبده ورسوله، اللهم اجعلنی من التوابین وجعلنی من المتطهرین،

سبحانک اللهم وبحمدک اشهد ان لا اله الا انت استغفرک و اتوب الیک.

## مهکروهاتی دهست نوێژ

١) زیادهڕۆیی یاچروکی نواندن بهشێوهیهك كه بهجوانی ئهندامهكانی دهست نوێژ تهڕ نهبێت.
٢) پێشخستنی لای چهپ بهسهر لای ڕاستدا. واته دهستی چهپ پێش دهستی ڕاست یان قاچی چهپ پێش قاچی ڕاست بشۆردری.
٣) ئاو كێشان به دهموچاودا به توندی.
٤) ووشكردنهوهی ئاوی دهست نوێژ بهخاولی، وا باش و سوننهته كه دوای دهست نوێژ خاولی یا ههر شتێكی تر بهكار نههێنین بۆ ووشك كردنهوهوی دهست ودهموچاو ...
٥) داوای یارمهتی كردن له كهسانی تر كه دهست نوێژت بۆ بگرن. واباشه خۆمان دهستنوێژبگرین بێ ئهوهی كهس یارمهتیمان بدات مهگهر لهبهر نهخۆشی.

## بەتاڵکەرەوەکانی دەست نوێژ

دەستنوێژ بەم شتانە بەتاڵ دەبێتەوە:

١) هەر شتێك لە پاش و لە پێش بێتە دەرەوە.

٢) بێ هۆش بوون بەهۆی لە هۆش چون یا نەخۆشی و شێتی.

٣) دەستدان لە عەورەت بەبێ پەردە.

٤) خەوتن و بێ ئاگا بون لە خۆ.

٥) دەست بەریەك کەوتنی ژن و پیاوی نامەحرەم.

# خۆئامادە کردن بۆ نوێژ

بەر لەنوێژکردن پێویستە مرۆڤی موسڵمان دەستنوێژی هەبێت و بەرگ و پۆشاکەکەی پاکژ بێت و لەسەر جێگەو شوێنێکی پاکژ بوەستێت و لەشولاری داپۆشراوبێت و ڕوەو قیبلە بوەستێت .. خۆ ئەگەر نوێژی فەرزی ئەنجام ئەدا ئەوا پێویستە کاتی نوێژەکە هاتبێت یاخود بانگی دابێت، دیارە سونەتە کە نزیك لە دیوار یان کۆڵەکەیەك نوێژەکەمان بکەین .. تا کەس بەبەردەماندا نەڕوات.

## ووشەکانی بانگ

الله أكبر الله أكبر — الله أكبر الله أكبر

أشهد أنّ لا اله الا الله — أشهد أنّ لااله الا الله

أشهد أنّ محمدا رسول الله — أشهد أنّ محمد رسول الله

حی علی الصلاة — حی علی الصلاة

حی علی الفلاح — حی علی الفلاح

الله أكبر الله أكبر

لا اله الا الله.

وەڵآمدانەوی بانگ: سوننەتە لەکاتی بانگدا خۆمان بێداربکەینەوەو وەڵآمی بانگي خوایی بدەینەوە، بەم شێوازەی لای خوارەوە:
لە کاتێکدا بانگبێژ ووتی: (ألله أكبر ألله أكبر) تۆیش لەدوایەوە هەمان شت دوویات بکەرەوە و بڵێ: (ألله أكبر ألله أكبر).
کە بانگ بێژ ووتی: (أشهد أن لا اله الا ألله) تۆش شاهیدی بدەو بیلێرەوەو بڵێ: (أشهد أن لا اله الا ألله).
کاتێك بانگبێژ ووتی: (أشهد أن محمد رسول ألله) ئەوا تۆش بڵێ: (أشهد أن محمد رسول ألله).
کاتێك ووتی: (حی علی الصلاة) سوننەتە تۆش بڵێیت: (لاحول ولا قوة الا بالله) وەکاتێکیش ووتی: (حی علی الصلاة) ئەوا تۆش بە هەمان شێوە لە وەڵآمدا بڵێ: (لاحول ولا قوة الا با الله). وە کاتێك بانگبێژ ووتی: (ألله أكبر ألله أكبر) ئەوا تۆیش وێنەی ئەو دوویات بکەرەوەو بڵێ: (ألله أكبر ألله أكبر). ئەوجا دوعای (وسیلة) بکەو بڵێ: (اللهم رب هذه الدعوة تامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسیلة والفضیلة وابعثه مقاما محمدا الذی وعدته).
پێش نوێژ کردن ئیتر نوێژی سوننەت بێت یان فەرز، سوننەتە قامەت بکەین بەم شێوەیە: الله اكبر الله اكبر، اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمد رسول الله، حی علی الصلاة، حی علی الفلاح، قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، الله اكبر، الله اكبر لا اله الا الله. دوای تەواو بوونی قامەت ئەنجا ڕوو لە قیبلە بکەو دەست بکە بە ئەنجامدانی نوێژەکەت ..

# نوێژ کردن

پاش ئەوەی بەجوانی دەست نوێژت گرت و پاکوخاوێن دوور لە هەموو پیسیەك لە بەرگ و پۆشاك و جێگای نوێژەکەدا، ئەوا ڕوو لەقیبلە دەکەیت و نیەتی نوێژەکەت دێنێت وەك ئەوەی لەدڵتا بڵێیت: نیەتمە دوو ڕەکات نوێژی بەیانی ئەکەم بە جەماعەت بۆ خوا، ئەوجا (الله اکبر) دەکەیت کە بەم ووشەیە (الله اکبر) دەڵێین ووشەی (تکبیر).



- دیارە پێویستە جوان ووشەی (الله اکبر) بەزمان بوترێت.
- لەکاتــی نیەت هێنــان و تەکبیردا (سونەتە دەستەکانمان بەرز بکەینەوە تا ئەندازەی شــانەکانمان یاخود تا ئەنــدازەی نەرمەی گوێمــان ئەوجا تەکبیرەکــە دەکەیــن و دەڵێین (الله اکبر)
- دواتــر بــە دەســتی ڕاســتمان لە مەچەکدا دەستی چەپمان دەگرین و لە ژێر سنگماندا دایدەنێین واتە لە سەرو ناوکەوە دەبێت دەستمان بگرین.



• دوعای دەست پێکردنی نوێژ دەخوێنم و دەڵێم: (سبحانک اللهم وبحمدک و تبارک اسمک وتعالی جدک، ولا اله غیرک) یاخود دەڵێی: (اللهم باعد بینی وبین خطایای کما باعدت بین المشرق و المغرب، اللهم نقنی من خطایای کما ینقیّ الثوب الابیض من الدنس، اللهم اغسلنی بالماء والثلج والبرد) دواتر بڵێ: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) وە بڵێ: (بسم الله الرحمن الرحیم) ئەنجا سورەتی (الفاتحە) بخوێنە، بەم شێوەیە:



(الحمد لله رب العالمين الرحمن الرحيم مالک يوم الدين اياک نعبدوا واياک نستعين اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين انعمت عليهم غير الغضوب عليهم ولا الظالين) ئەوجا بڵێ: (امين) پاش هەناسەیەك سورەتێکی تر یا چەندت پێبوو لە قورئان بیخوێنە ... بۆ نمونە، سورەتی الاخلاص.. (قل هو الله احد، الله الصمد، لم يلد و لم يولد، و لم يكن له كفوا احد) . و (بسم الله الرحمن الرحيم، قل اعوذ برب الفلق من شر ما خلق ومن شر غاسق اذا وقب و من شر نفاثات فی العقد و من شر حاسد اذا حسد).

و (بسم الله الرحمن الرحيم، قل اعوذ برب الناس مليک الناس اله الناس من شر الوسواس الخناس الذی يوسوس فی صدور الناس من الجنة و الناس) .



ئەوجا (الله اكبر) بکەو وێنەی تەکبیرەی یەکەم جار. تا نەرمەی گوێ یاخود تا ئاستی سەر شانەکان، دەستەکانت بکەرەوە با لەپی دەستەکانت ڕووەو قیبلە بێت وپەنجەکانت کراوەو جوت بێت .. ئەوجا بچۆرە ڕکوع ، وەك لە وێنەکەدا دیارە.



لەڕکوعدا پشتت بچەمێنەو بە هەردوو دەستت، سەر ئەژنۆکان بگرە و پشتت تەخت و ڕێك بکەو ئەوجا بڵێ: (سبحان ربی العظیم وبحمده) سێ جار.



• ئەوجا سەر بەرزدەکەیتەوە تا پشتت ڕێك دەبێتەوەو بەجوانی بە پێوە دەوەستیت و هەردوو دەستەکانت بەرز دەکەیتەوەو دەڵێیت: (سمیع الله لمن حمده) کەڕێك وەستایت و لە جوڵە کەوتیت دەڵێییت (ربنا لک الحمد) .



• ئەوجا (الله اكبر) بكەو بچۆرە كڕنوش بردن. كڕنوش بردنیش لەسەر حەوت جێگەیە هەردوو قاچ و هەردوو ئەژنۆ و هەردوو بەری دەست و نێو چاوانە لەگەڵ لووتیدا. نابێت هیچ بەشێك لەم حەوت جێگەیە لە زەوی هەڵبڕابێت لەکاتی سوجدە و کڕنوش بردندا. کاتی کڕنوش بڵێ: (سبحان ربی الاعلی وبحمده) سێ جار.



• ئەوجا (الله اكبر) دەکەیت و لەسەر ئەژنۆ دادەنیشیت و قاچەکانت لە ژێر خۆتدا دەبێت و هەردوو دەست لەسەر هەردوو ئەژنۆ دادەنێیت. بەشێوازێك سەری پەنجەکان نزیك بێت لەسەر ئەژنووە...

• ئەوجا سوننەتە لەنێوان دوو سوجدەدا بڵێی:

(رب اغفرلی وارحمنی واهدنی وعافنی وارزقنی)، دواتر (الله اكبر) دەکەیت و وێنەی کڕنوشەکەی یەکەم کڕنوشێکی دی دەبەیت..



تیایدا دەڵێیت: (سبحان ربی الاعلی وبحمده) سێ جارو دواتر (الله اکبر) دەکەیت و بەمەش رەکاتی یەکەم تەواو دەکەیت و هەڵدەستیتەوە بۆ ئەنجامدانی رەکاتی دووەم. لە ڕەکاتی دووەمدا پێویست ناکات دوعای سەرەتاو (استعاذة) بخوێنرێتەوە، واتە (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بانەوترێت .. خۆ ئەگەر کەسێکیش (استعاذة) ی ووت ئەوە قەیدی ناکات . ئەوجا (بسم الله) دەخوێنرێت و سورەی فاتحە و سورەتێکی تر ... ئەوجا وێنەی رەکاتی یەکەم ڕکوع و سوجدە دەبەیت پاش تەواو بونی سوجدەی دووەم .. (الله اکبر) دەکەیت و دادەنیشیت بۆ خوێندنی (التحیات).



شێوەی دانیشتن بۆ (التحیات): قاچی چەپ لەژێر خۆماندا ڕادەخەین و لەسەری دادەنیشین و سنگی قاچی ڕاستیش ڕێك دادەنێین و دەستەكانیش نزیك لە ئەژنۆوە دادەنێین. دەستی چەپ ڕادەخەین لەسەر ڕانی چەپمان بەكراوەیی، دەستی ڕاستیش هەموو پەنجەكانی دادەخەین جگە لەپەنجەی شایەتومان كەبەڕێك و نەنوشتاوەیی دەیهێڵینەوە تالەكاتی شایەتوماندا ئیشارەتی پێبكرێت.

چۆنیەتی (التحیات): لەكاتی ئەم دانیشتنەدا كەباسكرا بەم شێوەیە تەحیات دەخوێنرێت: (التحیات لله والصلوات والطیبات،

السلام علیک ایها النبی ورحمة الله وبرةکاته، السلام علینا وعلی عباده الله الصالحین اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله اللهم صل علی محمد وعلی ال محمد) وا باشه ئەم سەڵاواتە تەواو بکات و بڵێ: (کما صلیت علی ابراهیم ۃعلی ال ابراهیم . وبارک علی محمد وعلی ال محمد کما بارکت علی ابراهیم وعلی ال ابراهیم انک حمید مجید). دەتوانرێت دوای خوێندنی (التحیات) و صەلاوات دان هەندێك دوعاو پاڕانەوە بخوێنێت لەوانە (اللهم انی اعوذ بک من عذاب جهنم وعذاب القبر، ومن فتنة المحیا والممات ومن فتنة المسیح الدجال). یاخود: (اللهم اعنی علی ذکرک وشکرک وحسن عبادتک) وە یاخود (ربنا اتنا فی الدنیا حسنة و فی الا خرة حسنة وقنا عذاب النار). ئەم جا هەر بە دانیشتنەوە بەلای ڕاستدا لا بکەرەوە و بڵێ: (السلام علیکم ورحمة الله).



ئەوجا بەلای چەپدا لابکەرەوەو بڵێ (السلام علیکم ورحمە الله). جا ئەوەندە لابکەرەوە کەلە پشتتەوە ڕومەتت ببینرێت .. بەم سەلام دانەوەش نوێژەکە کۆتایی پێ دێت ..



دیاره ئەگەر نوێژەکە دوو رەکات بو وەك نوێژی بەیانی بەم شێوازە دەکرێت .. خۆ ئەگەر سێ رەکات بوو وەك نوێژی (شێوان) ئەوا دوای (التحیات) یەکسەر (الله اکبر) بکات و هەڵ بسێتەوە و رەکاتێکی تر ئەنجام بدات و دوای سوجدە کان (التحیات) ی دووەم بخوێنێت ئەوجا سەلام بداتەوە.

خۆ ئەگەر نوێژەکە چوار رەکاتی بوو وەك (نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا) ئەوا دوای تەواوبونی تەحیاتی یەکەم هەڵبسێتەوەو دوو رەکاتی تر ئەنجام بدات وەکو وێنەی دوو رەکاتی یەکەم ..واتە (نوێژی چوار رەکات وەك دوپاتکردنەوەی دوو نوێژی دوو رەکاتی وایە بەلآم ئەوەندە هەیە ، لە رەکاتی سێهەم و چوارەمدا تەنها سورەتی (الفاتحە) دەخوێنرێت. ئیتر سوننەت وایە کە سورەتی دی نەخوێنرێت ، وەهەروەها سەلام دانەوە دەکەوێتە کۆتاییەوە) ئەوجا دوای تەحیاتی دووەم بەلای ڕاست و چەپدا سەلام بداتەوە.

# زیکری دوای نوێژ

دوەای تەواو بونی نوێژ سونەتە دڵ و زمانمان پاراو بکەین بە چەند ویردو زیکرێك لەوانە: (استغفرالله) ٣جار. (اللهم انت السلام ومنک السلام تبارکت یا ذاالجلال والاکرام لا اله الا الله وحده لاشریک له، له الملک، وله الحمد، وهو علی کل شی قدیر لاحول ولا قوة الا بالله، لا اله الا الله ولا نعبد الا ایاه، له النعمة وله الفضل، وله الثناء الحسن، لااله الا الله مخلصین له الدین ولو کره الکافرون).

(اللهم اعنی علی ذکرک وشکرک وحسن عبادتک). دواتر سوننەتێکی گەورەیە کەئەم زیکرانەش بکەین:

سی وسێ جار بڵێ: (سبحان الله) و سی وسێ جار بڵێ: (الحمد لله) و سی و سێ جار بڵێ: (الله اکبر) بەمەش (٩٩) جار دەکات بۆ جاری سەد هەم بڵێ(لا اله الا الله وحده لا شریک له، له الملک وله الحمد وهو علی کل شی قدیر). ئەوجا ایەالکرسی بخوێنە (البقرة ٢٥٥) (الله لا اله الا هو الحی القیوم لا تاخذه سنة ولا النوم له ما فی السموات وما فی الارض من ذا الذی یشفع عنده الا باذنه یعلم ما بین أیدیهم و ما خلفهم و لا یحیطون بشی من علمه الا بما شاء وسیع کرسیه السموات والارض و لا یؤده حفظهما و هو علی العظیم). سورەتی اخلاص و معوزتین بخوێنە، دواتر بە دڵی خۆت ڕوو لەقیبلە بکەو دوعا بکە.

## نوێژ و ڕەکاتەکان

هەموو موسڵمانێك لەسەری فەرزە لە هەر ڕۆژێكدا پێنج جار نوێژ بکات لە پێنج کاتی دیاری کراودا .. ئەویش بە م شێوەیە:

١) نوێژی بەیانی دوو ڕەکاتە

٢) نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕەکاتە

٣) نوێژی عەسر چوار ڕەکاتە

٤) نوێژی شێوان سێ ڕەکاتە

٥) نوێژی عیشا چوار ڕەکاتە

هەروەها بابزانین کە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە دەنگی نزم دەکرێت ئەگەر بە جەماعەتیش بێت، بەڵآم نوێژی بەیانی و شێوان و عیشا بە دەنگی بەرز و ئاشکرا دەکرێت.

# نوێژی سوننەت

لەگەڵ هەر لەم پێنج فەرزەدا چەند نوێژێکی سوننەت هەیە کە خێر وپاداشتیان زۆر گەورەو مەزنە، خێری لە هەموو دنیا زیاترو گەورەترە، دەبێت هەوڵ بدەین ئەو نوێژانە بپارێزین و ئەنجامیان بدەین ئەویش بەم شێوەیە:

١) نوێژی بەیانی: بەر لە نوێژی بەیانی سوننەتە دوو رەکات نوێژ بکەین بڵام دوای نوێژی بەیانی نوێژی سوننەت نییە.

٢) سوننەتە پێش نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕەکات یاخود چوار ڕەکات پێکەوە یان بەجیا دوو دوو ئەنجام بدرێت، بەهەمان شێوە سوننەتە لە دوای نوێژی نیوەڕۆ دوو یان چوار رەکات ئەنجام بدرێت.

١) سوننەتە بەر لەکردنی نوێژی عەسریش دوو رەکات یا چوار ڕەکات ئەنجام بدرێت.

٢) سوننەتە پێش نوێژی شێوان دوو ڕەکاتی خێرا ئەنجام بدرێت و دوو ڕەکاتیش بکرێت دوای ئەنجامدانی نوێژی شێوان.

٣) سوننەتە بەر لەکردنی نوێژی عیشا دوو رەکات سوننەت بکەین هەروەها دوای نوێژی عیشایش سوننەتەدوو رەکاتی تر بکرێت.

٤) ئەوجا سونەتە کە نوێژی وەتر بکرێت کە خوارەوەکەی یەك

ڕەکاتە و زۆرەکەی حەوت ڕەکاتە. بەڵآم ئەگەر بتوانرێت بەردەوام سێ ڕەکات بکرێت ئەوا کارێکی پیرۆزو چاکە ..

نەخشەی نوێژ کردن:

| ناوەکان | ڕەکاتەکان | سوونەتی پێشەوە | پلەکەی | سوونەتی پاش نوێژ | پلەکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| بەیانی | ٢ | ٢ | موئەکەد | ------ | ------ |
| نیوەڕۆ | ٤ | ٢ یان ٤ | موئەکەد | ٢ یان ٤ | موئەکەد |
| عەسر | ٤ | ٢ یان ٤ | غیرموئەکەد | ------ | ------ |
| ئێوارە | ٣ | ٢ | غیرموئەکەد | ٢ | موئەکەد |
| عیشا | ٤ | ٢ | غیرموئەکەد | ٢ یا ٣ بە وترەوە | موئەکەد |

خوشکی بەڕێز بێدار بە: لە کاتی نوێژدا ئاگات لەم خاڵآنە بێت:

١) تەنها با دەست تا مەچەك و دەموچاو بە دەرەوە بێت ، باقی لاشە و سەرو قژت با دا پۆشراوبێت، وە ئەگەرنا نوێژەکەت بەتاڵ دەبێت.

٢) خۆت کۆبکەرەوەو لە کاتی کڕنوشدا با ئەندامەکانی لاشەت کۆبن و سك بابە ڕانەوە بلکێت .. بەڵآم بۆ پیاو سوننەت وایە کە سنگ و ڕان لەیەکەوە دوور بێت و پەلەکان کراوەبن.

٣) گەرچی بانگ سوننەت نیە بۆ ئافرەت بەڵآم سوننەتە کە قامەت ئەنجام بدات.

٤) قاچەکانت لە بیر نەچێت بە داپۆشراوی بیانهێڵەرەوە چەندە توانیت .

ئەم شتانەی لای خوارەوە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە:

١) قسەکردن.

٢) کردەوەو جموجوڵی زۆر.

٣) پیس بوونی جلوبەرگ.

٤) لەبەر لاچونی پۆشاك و دەرکەوتنی لاشە.

٥) خواردن و خواردنەوە.

٦) بێ دەستنوێژ بون.

٧) ڕوو لە قیبلە وەر گێران.

# سوجدەی سەهو



گەر کەسێك لە نوێژەکەیدا لێی تێکچوو دواتر دەبێت هەر لە نوێژەکەیدا خۆی چاك بکاتەوە، ئەگەر ڕکوع یا سوجدەی لە بیر چوو ئەوا پێویستە ڕەکاتێکی تەواو لە بری ئەو لەبیرچونە بکاتەوە، خۆ ئەگەر گومانی لە ژمارەی ڕەکاتەکاندا بوو با کەمەکەدابنێت و نوێژەکەی تەواو بکات... بۆ نمونە، ئەگەر گومانت بوو کە ئایا سێ یا چوار ڕەکاتت کردووە، ئەوا کەمەکە دابنێ کە سێ ڕەکاتەو هەستەوە ڕەکاتێکی دی ئەنجام بدە دواتر سوجدەی سەهو ببە.

سوجدەی سەهو دوو سوجدەیە دوای خوێندنی تەحیاتی کۆتایی و پێش سەلام دانەوەیە، شێوازەکەیشی هەروەکو دوو سوجدەی نوێژ وایە و وێنەی ئەوان دەوترێت: (سبحان ربی الاعلی).

# گەردن کەچی

وەك چۆن پێویستە لەکاتی نوێژ هەموو ڕوکن و ڕەکاتەکانی نوێژ بە جوانی ئەنجام بدەین ئاواش پێویستە کەلەکاتی نوێژدا گەردن کەچ بین، چونکە لە کاتێکدا تۆ نوێژ دەکەیت ئەوا بزانە ڕوەو قیبلە کە لە خزمەتی خوای گەورەدا وەستاویت و گفتوو گۆ لە خزمەت ئەودا ئەنجام ئەدەیت، بیر بکەرەوە لەوەی دەیڵێیت و دەیخوێنیتەوە، تێبگە لەواتای سەر دانەواندن و کڕنوش بردن، کە دەبێت لە ئاست هەموو فەرمانێکی خواییدا ئاوا گەردن کەچ و گوێڕایەڵ بین، دوور لە سەر پێی و لووت بەرزی، بەمەش خوا لە خۆت ڕازی دەکەیت و لە خزمەتی هاوەڵانی نوێژ پاك و ڕۆژ و پاکدا بەرەو بەهەشتی خوایی بەڕێ دەکویت...

## چەند فەرموودەیەک سەبارەت بە نوێژ :

### دەست نوێژ:

١) عن ابی هریره (ر) قال: سمعت رسول الله (ص) یقول: «ان امتی یدعون یوم القیامة مججلین من اثار الوضوء. فمن استطاع منکم ان یطیل غرته فلیمجل» متفق علیه. واتە : لە ئەبو هورەیرە وە (ڕەزای خوای لێنێت) ووتوەیەتی: بیستومە لە پێغەمبەری خواوە (درودو سەلامی خوای لێبێت کە فەرمویەتی: (ئومەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا دەست ودەموچاویان پرشنکدارە کە بانگ دەکرێن، ئەیش بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژ گرتنەوە، بۆیە هەرکەسێك لە ئێوە گەر توانی زیاتر دەموچاوی بشوات با بیکات).

٢) وقال: «تبلغ الحلیة من المؤمن حیث یبلغ الوضوء» رواه مسلم. واتە پێغەمبەر (درودو سەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (خشڵ و زێڕی باوەڕدار بەئەندازەی شوێنی دەستنوێژ گرتنەکەیەتی).

٣) قال رسول الله (ص): (من توضأ فاحسن الوضوء، خرجت خطایا ه من جسده حتی تخرج من تحت اظفاره) رواه مسلم. واتە پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لێبێت). فەرمویەتی: (هەرکەسێك بە جوانی دەستنوێژ بگرێت، ئەوا گوناهی لاشەی لە ژێر نینۆکەکانیەوە دەچێتە دەرەوە) .

## بانگ

١) قال رسول الله (ص): « المؤذنون اطول الناس اعناقا يوم القيامة » رواه مسلم. واته: پێغەمبەری خوا (درووود و سەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (بانگ بێژەکان سەر بەرز ترین کەسن لە ڕۆژی قیامەتدا).

٢) قال رسول الله (ص): (من قال حين يسمع النداء: (اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة ات محمدا الوسيلة و الفضيلة ، وابعثه مقاما محمودا الذى وعدته) حلت له شفاعتى يوم القيامة). رواه البخارى.

واته: پێغەمبەری خوا (درووود و سەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (هەرکەسێك گوێی لە بانگەوە بو ئەویش ووتی: (ئەی خوای ئەم بانگەوازە تەواوە و ئەم نوێژە ڕاست و دروستە، پلەی (الوسيلة) ی بەهەشت ببەخشە بە (محمد) (درووود وسەلامی خوای لێبێت) و هەروەها پلەی (محمود)ی سوپاسگوزاری پێ ببەخشە کە خۆت پەیمانت پێ داوە) ئەوا شەفاعەتی من بۆ ئەو مسۆ کەر دەبێت).

## نوێژ

١) قال رسول الله (ص): (من صلى البردين دخل الجنة) متفق عليه. واته: پێغەمبەری خوا (درووودو سەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (هەر کەسێك نوێژی بەیانی و عەسر، لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە).

٢) قال رسول الله (ص): (بين كل اذانين صلاة) متفق عليه. واته: پێغەمبەلای خوا ( درووود وسەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (لە نێوان هەر بانگ و قامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە)

٣) قال رسول الله (ص): «ان الله وتر يحب الوتر، فاوتروا ياأهل القران» رواه ابوداود و الترمزى و قال حديث حسن. واته. پێغەمبەری خوا (درووود و سەلامی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (خوای گەورە تاك و تەنهایە و تاکی خۆش دەوێت، دەی ئێوەش ئەی ئەهلی قورئان نوێژی "سوننەتی وەتر" بکەن).

